

# 7 کەڵەشێر

دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ

SPIREZ PRESS & PUBLISHER

خودانێ ئمتیازێ : حافظ قاضی

سەرنڤیسەر : مؤید طیب

هژمارا کتێبێ : 31

ناڤێ کتێبێ : 7 کەڵەشێر

نڤیسین : ژاک لاکاری یر

وەرگێران ژ فارسی :

بۆ کرمانجیا ژێری : نەجیبە ئەحمەد

بۆ کرمانجیا ژۆری : زوبەیدا سەید سالح

پێداچوونا زمانی : موئەیەد تەیب ( کرمانجیا ژۆری )

نیگار : نەجمەددین بیری

تیپچنین : شێرزاد محمد عمر

دەرهێنانا هونەری : نزار رشاد

سەرپەرشتکارێ چاپێ : زاگروس محمود

ژمارا سپاردنێ : ( ) 2003

چاپخانە : وەزارەتا پەروەردێ ـ هەولێر

تیراژ : (1000) دانە

چاپا ئێکێ



کوردستانا عیراقێ ـ دهوک

ئاڤاهیێ سەندیکا کرێکارێن کوردستانێ ـ ڤاتێ سێیەم

تەلەفون 7225376 www.spirez.com

# ٧

# گەڵەشێر

نڤیسین

ژاک لاکاری یر

وەرگێران

نەجیبە ئەحمەد (کرمانجیا ژێری)

زوبەیدا سالح (کرمانجیا ژۆری)

پێداچوونا زمانی

موئەیەد تەیب (کرمانجیا ژۆری)

نیگار

نەجمەددین بیری

دهـــوک 2003

سپیریز

ل سەر کۆپێ چیایەکی، ل گوندەکێ جوان، حەفت دیکل هەبوون. حەفت دیکلێن حەفت رەنگ. رەنگێ هەر ئێکی وەکی رەنگەک ژ رەنگێن کەسکوسۆری بوو.
دگەل ئەلندا هەر رۆژەکێ، ئێك ژ وان دیکلان بانگ ددا و ب بانگێ وی، ئەسمانێ گوندی رەنگێ پەرێن وی دگرت.

لەسەر لوتکەی کێوێك، لە دێیەکی جواندا، حەوت کەڵەشێر ئەژیان. حەوت کەڵەشێری حەوت رەنگ، رەنگی هەر یەکێکیان وەکو رەنگێك لە رەنگەکانی پەلکە زێرینە بوو.
بەرەبەیانی هەر رۆژێك یەکێ لە کەڵەشێرەکان ئەیقوقاند و بە ئاوازی خوێندنەکەی ئاسمانی گوندی وا لێئەکرد کە رەنگی پەرەکانی کەڵەشێرەکەی لێبنیشێ.

رۆژا ئێکێ ژ حەفتیێ، ئانکو شەمبیێ، گەرا دیکلێ ئێکێ بوو. لەشێ دیکلێ ئێکێ ژ پورکا سەرێ وی هەتا دویماهیا کوریا وی وەسا یێ سۆر بوو کو هەمیا گازی دکرێ "قیقیێ نیسانۆك". دەما قیقیێ نیسانۆك بانگ ددا، هەتاڤ وەسا دشاریا کو ئەسمان تێکدا سۆر دبوو و پاشی ئەو سۆراتی ژ ئەسمانی دادکەتە ناڤ مالێن گوندی.

یەکەمین رۆژی حەفتە، واتە شەممە نۆرەی کەڵەشێری یەکەم بوو. لەش لاری ئەم کەڵەشێرە لە پۆپنەکەیەوە بیگرە تا وەکو کلکی ئەوەندە سوور بوو کە هەموو پێیان ئەوت ))قوقولی گوڵاڵە((، کاتێ قوقولی گوڵاڵە دەستی بە خوێندن ئەکرد، هەتاو ئەوەندە گەرم دائەهات کە تێکرای ئاسمان سوور هەئەگەڕا و سوورایەکەی لەو بەرزاییەوە ئەرژایە ناوماڵەکان.

رۆژا دووێ ژ حەفتیێ، ئانکو ئێکشەمبێ، دیکلێ دووێ بانگ ددا. لەشێ وی هەمی یێ پرتەقالی بوو. ژ بەر هندێ دگوتنێ "قیقیێ پرتەقالی". دەما وی بانگ ددا، ئەسمان وەکی سندۆقەکا تژی دوڕ و گەوهەر دتەیسی.
چیا و لوتکە و گەلیێن گوندی هەمی وەکی گولچیچەکەکا زەرا باڤ پرتەقالی لێ دهاتن.

رۆژی دووەم یانی یەك شەممە، دووەم کەڵەشێر ئەیقوقاند. ئەمیان سەرتاپای نارنجی بوو. بۆیە پێیان ئەوت )) قوقولی نارنج((. کە ئەیخوێند ئاسمان وەکو سنوقێکی پڕ لە گەوهەر ئەدرەوشایەوە. شاخ و لوتکە و دۆڵی گوندەکە وەکو گولیلکە زەردە نارنجی ئەبوون.

رۆژا دوشەمبێ کو رۆژا سیێ ژ حەفتیێ یە، دۆرا دیکلێ سیێ بوو کو بهێت و بانگ بدەت. رەنگێ وی وەسا یێ زەر بوو یا ژ هەمیا ڤە ئەو کناری یە و هەمیا ژی دگۆت: "سەیرە، بۆچی ئەڤ کناری یە وەکی کناریێت دی ئاوازا ناخوینیت؟" ناڤێ دیکلێ سیێ "قیقیێ پەرزێرین" بوو. دەما بانگ ددا، ئەسمانێ گوندی رەنگێ هنگڤینی دگرت و تیرۆژکێن زەر ل هەمی رەخان بەلاڤ دبوون لێ مشکێن کۆرە خۆ ب سەرڤە نەدبر و د خەو دا دمان.

دوو شەممە سێیەمین رۆژی حەفتە، نۆرەی کەڵەشێری سێیەم بوو کە بێت و بقوقێنێ. ئەو رەنگی زەرد یوو، ئەوەندە زەرد بوو کە هەموو وایان ئەزانی کەنارییە و بەیەکیان ئەوت: " چەند سەیرە! ئەم کەنارییە بۆچی وەکو کەناریەکانی تر ناخوێنێ؟"

ناوی کەڵەشێری سێیەم )) قوقولی پەڕزێرین(( بوو. کاتێ ئەیقوقاند ئاسمان رەنگی هەنگوینی ئەبوو و نورێکی زەرد بە هەموو لایەکدا بڵاوئەبوەوە، بەڵام مشکە کوێرەکان خۆیان لێ کەڕ ئەکرد و هەروا ئەخەوتن.